# الولاء و البراء فى الإسلام

**ئەم كتابی (الولاء و البراء)ە ئەم بابەتانەی خوارەوەی تێدا باسكراوە و ڕونكراوەتەوە .**

١- سەرەتا .

٢- واتای الولاء و البراء .

٣- أنواع الولاء ( پلەكانی الولاء ) .

٤- شێوازەكانی ( ڕێگاكانی ) موالاتكردنی ئیمانداران .

٥- ئەو كەسانەی كە ولاء و براء یان بە سەر دا جێ بەجێ دەكرێت .

٦- أنواع البراء .

٧- شێوازەكانی ( ڕێگاكانی ) براءة كردن لە كافر و مورتەدان .

٨- أنواع الولاء و البراء أكبر مخرج من ملة .

٩- الولاء و البراء أصغر غير مخرج من ملة .

١٠- ئەو هۆكارانەی كە دەبنە موالات بۆ كافر و مورتەدەكان .

# الولاء و البراء فی الإسلام

بسم الله الحمدلله وصلاة وسلام على رسوله الله وعلى آله وصحبه وهتدابهداه وبعد

له دوای خۆشویستنی الله تعالى و پێغەمبەرەکەی صلى الله عليه و سلم پێویستە موسوڵمانان دۆستانی الله تعالى یان خۆش بوێت دووژمنایەتی دووژمنانی الله تعالى و پێغمبەرەکەی صلى الله عليه وسلم بکات .

یەکێك لەبنچینەکانی عەقیدە و بیروباوەڕی ئیسلامی بریتیە لە ( الولاء والبراء ) کە پێویستە هەموو موسوڵمانێک ئەم عەقیدەی الولاء والبراء بە دین بزانێت و پەیڕەوی بکات ، وە ولائی هەبێت بۆ شوێن کەوتووەکانی و دووژمنایەتی دووژمنەکانیش بکات ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە موسوڵمانانی خۆش بوێت و وەلاءی هەبێت بۆیان وە ڕقی لە موشریکان بێت و دووژمنایەتیان بکات .

ئەمەش مەنهەجی میلەتی ابراهیمە عليه صلاة سلام و ئەوانەش کە لەگەڵی دابوون و شوێنی کەوتوون کە الله تعالى فەرمانی پێکردوین کە چاویان لێبکەین و اقتیدایان پێوە بکەین .

الله عزوجل لە ئایەتی ٤ الممتحنة : ( قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَآءُ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ) ئەی ئیمانداران، بەڕاستی لە ئیبراهیم و ئەوانەی کە لەگەڵیدا بوون نموونەیەکی چاکتان خراوەتە بەرچاو، کاتێك کە بە قەومەکەی خۆیانیان وت: دوای ساڵەها بانگەواز، ئێمە بەرین لە ئێوە و لەو شتانەش کە لەجیاتی خوا دەیپەرستن، ئێمە باوەڕمان بەو دین و ئاینەی ئێوە نیە، ئیتر دوژمنایەتی و ڕقەبەرایەتی لەنێوانماندا بەرپا بووە تا ئەو کاتەی کە باوەڕ بە خوای تاك و تەنها دەهێنن .

هەروەها ئەمە دینی محمده صلی الله علیه وسلم ، الله تعالی لە سورەتی المائدة ئایەتی (٥١) دەفەرمویێت : ( يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا الْيَهُودَ وَالنَّصَارَىٰ أَوْلِيَاءَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ) ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە جولەکەو گاور مەکەنە یارو یاوەرو پشتیوانی خۆتان ئەوانە هەندێکیان پشتیوان و پشتگیری یەکترن، ئەو کەسەی پشت بەوان ببەستێت، ئەوە هەر لەوانە و (حسابی ئەوانی بۆ دەکرێت) بەڕاستی خوا هیدایەتی قەومی ستەمکار نادات...

ئەم ئایەتە دەربارەی حەڕامێتی خۆشویستنی اهلی کیتاب واتە گاورو جولەکە هاتووە بەشێوەیەکی تایبەتی .

وە لە بارەی خۆشویستنی کافران ( کافری اصلی ، مورتەد ) بەشێوەیەکی گشتی الله عزوجل لەئایەتی ١ الممتحنه دا دەفەرمویێت : ( يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاءَ تُلْقُونَ إِلَيْهِم بِالْمَوَدَّةِ وَقَدْ كَفَرُوا بِمَا جَاءَكُم مِّنَ الْحَقِّ ) ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە دوژمنانی من و دوژمنانی خۆتان مەکەنە دۆستی گیانی بە گیانی ، لەکاتێکدا خۆشەویستی و سۆزی خۆتانیان بۆ دەردەبرن ، بەڕاستی ئەوان بێ باوەڕیش بوون بەوەی لە لایەن خواوە بۆتان هاتووە .

الله ی گەورە خۆشەویستی کافرانی حەڕام کردوە لەسەر موسوڵمانان ئەگەر چی ئەو کافرانە نزیك ترین کەسیشیان بن .

الله عزوجل دەفەرمویێت : ( يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا آبَاءَكُمْ وَإِخْوَانَكُمْ أَوْلِيَاءَ إِنِ اسْتَحَبُّوا الْكُفْرَ عَلَى الْإِيمَانِ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ ) التوبة (٢٣) ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، باو و باپیران و براکانتان مەکەنە پشتیوان و خۆشەویستی خۆتان ، ئەگەر ئەوان بێ باوەڕیان خۆش ویست و هەڵیانبژارد

بەسەر ئیمان و باوەڕدا، هەرکەس لە ئێوە پشت بەوان ببەستێت و خۆشی بوێن، ئائەوانە هەر ستەمکارن .

وە لە ئایەتێکی تردا الله تعالى دەفەرموێت : ﴿ لَّا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ ﴾ المجادلة (٢٢) کەسانێکت دەست ناکەوێت باوەڕ بهێنن بە خواو بە ڕۆژی دوایی، لەکاتێکدا کەسانێکیان خۆش بوێت کە دژایەتی خواو پێغەمبەرەکەیان کردبێت، ئەگەرچی ئەو دوژمنانە باوو باپیریان بن یان نەوەیان بن یان برایان بن یان عەشیرەتیان بن .

بەڵام زۆرێك لەخەڵکی بێ ئاگان لەم بنچینە گەورەیە هەتا بە شێوەیەک هەندێك کەس کە ناویان لەخۆیان ناوە بانگخواز کاتێک باس لە گاور و جولەکە دەکەن دەڵێن ئەوانە برامانن بە ڕاستی ئەمە وشەیەکی زۆر هەڵەیە و ترسناکە ئەگەر بەرامبەر ئەوانە بەکاربهێنرێت چونکە ئەوانە دووژمنی الله و پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم و ئیماندارانن .

وە الله تعالى هەروەك و چۆن خۆشەویستی کافران و دووژمنانی دین و عەقیدەی ئیسلامی حەڕام کردوە لەسەر ئیمانداران ، لەهەمان کاتدا خۆشەویستی ئیماندارانی واجب کردووە لەسەر یەکتر .

کەواتە الولاء خۆشەویستی دەبێت تەنها بۆ الله عزوجل وپێغەمبەر صلى الله عليه وسلم و ئیمانداران بێت بە تەنها ، الله تعالى دەفەرموێت : ﴿ إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَالَّذِينَ آمَنُوا الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَهُمْ رَاكِعُونَ ﴾ المائدة (٥٥) بە ڕاستی تەنها خۆشەویست و پشتیوانی ئێوە، هەر خواو پێغەمبەرەکەی و

ئەوانەن باوەڕیان هێناوە، کە نوێژەکانیان بەچاکی ئەنجام دەدەن و زەکات لە ماڵ و سامانیان دەردەکەن و هەمیشە دیاردەی کڕنوش و ملکەچییان بۆ پەروەردگار پێوە دیارە .

(وَمَن يَتَوَلَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالَّذِينَ آمَنُوا فَإِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْغَالِبُونَ) المائدة (٥٦) جا ئەوەی خوا و پێغەمبەرو ئەوانەی بڕوایان هێناوە بەپشتیوان و خۆشەویستی خۆی قەبوڵ بکات، ئەوە با دڵنیا بێت کە هەر کۆمەڵ و دەستەو تاقمی خوا، زاڵ و سەرکەوتوون .

وەهەروەها الله تعالى دەفەرموێت : ( مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ اللَّهِ ۚ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ ) الفتح (٢٩) محمد صلى الله عليه وسلم ڕەوانە کراوی خوایە ، ئەوانەش کەلە خزمەتیدان و شوێنی کەوتوون توند و تیژن بەرامبەر بێ باوەڕان و بەبەزەیی و میهرەبانن لەنێوان خۆیاندا .

وەهەروەها الله تعالى دەفەرموێت : ( إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ ) الحجرات (١٠) لەڕاستیدا هەر ئیمانداران برای یەکن .

جا بۆیە ئیمانداران برای یەکترن لەدین و عەقیدەدا ئەگەر چی خزمێکی دووری یەکتریش بن یان ئەگەر خزمی یەکتریش نەبن یان هەر خەڵکی یەک شوێنیش نەبن یان ئەگەر هەر لە یەک شوێنیش نەبن یان ئەگەر لە یەک سەردەمیش نەژیابن ، الله تعالى دەفەرموێت : ( وَالَّذِينَ جَاءُوا مِن بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ) الحشر (١٠)

ئەوانەش کە بە شوین کۆچبەران و پشتیوانانیاندا هاتن (تا کۆتایی دنیا ئەمە دۆعا و نزایانە و بەردەوام) دەڵێن: پەروەردگارا لە ئێمە و لە برایانەشمان خۆش ببە کە پێش ئێمە ڕێبازی ئیمانیان گرتەبەر و لە دڵەکانماندا هیچ جۆرە بوغزو

کینەیەک مەخەرە دڵمانەوە لە ئاستی ئەوانەی ئیمانیان هێناوە، پەروەردگارا تۆ بەڕاستی بەسۆزو بەخشندە و میهرەبانیت .

لەبەر ئەمە موسوڵمانان لە یەکەم دانەیان هەتا کۆتا دانەیان هەر چەندە شوێنیان لە یەك دوور بێت و کات و زەمەنی ژیانیان لە یەك دوور بێت هەر برا و خۆشەویستی یەکترن کۆتا دانەیان چاو لە یەکەم دانەیان دەکات و دوعا و داوای لێخۆشبون بۆ یەکتر دەکەن .

**پێشەکی کۆتایی هات**

# واتای الولاء و البراء

**الولاء** لە زمانەوانیدا : واتا خۆشەویستی کە ئەمە ئەصڵی مانەکەیەتی .

**الولاء** لە شەرعدا : واتە خۆشەویستی و پشتگیری کردن و سەرخستن .

**البراء** لە زمانەوانیدا: واتە ڕق لێبوون کە ئەصڵی البراء .

**البراء** لە شەرعدا : واتە ڕق لێبوون و دژایەتی کردن .

# انواع الولاء جۆرەکانی الولاء

← 1 الوالاء اتامة خۆشەویستی تەواوەتی (کامل)

ئەم جۆرە ولائە بۆ ئیماندارانە واتە تەنها بۆ ئیمانداران دەخرێتە کار و صەرف دەکرێت ئەویش بە ( خۆشویستن ، پشتگیری کردن ، سەرخستن ، نەصیحەتکردن ، سەلام لێکردنیان ، دووعاکردن بۆیان ، دڵ خۆش بوون بەخۆشیەکانیان ، وە پێ ناخۆشبوون بە ناخۆشیەکانیان ، وە بەژداری کردن لە خەم و خەفەتەکانیان ، وە شوێن کەوتنی جەنازەیان ، وە سەردانی نەخۆشیان ) ، الله تعالى دەفەرموێت : ( وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ ) التوبة (٧١) (لەو لاشەوە) ئیمانداران لە پیاوان و لە ئافرەتان هەندێکیان خۆشەویست و پشتگیر و هاوکاری یەکترن ، ئەم جۆرە ولائە پێی دەوترێت ( الولاء التام ) سەرف دەکرێت تەنها بۆ الله تعالى و پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم پاشان بۆ ئیمانداران کە بە تەواوی خۆیان یەك لا کردۆتەوە بۆ خزمەت کردنی دینی الله تعالى ئەوانیش لەئالوبەیتی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم و خێزانە بەڕێزەکانی لە کەسە نزیکەکانی لە ئیمانداران وە لە صەحابە بەڕێزەکان کە هەموو ژیانیان بە تەواوی تەرخان کرد بۆ خزمەتکردن و سەرخستنی ئەم ئیسلامە .

وە لەم سەردەمەش دا ئەوانەی بە تەواوی خۆیان یەکلاکردۆتەوە بۆ سەر خستنی ئەم دینە شەو و ڕۆژیان خستۆتە سەریەك و وازیان هێناوە لە دنیا ئەمانەش (موجاهیدانن) کە دەبێت ولائی تامیان بۆ سەرف بکرێت .

ئەوە ئەصڵی ولائە کە دەبێت بۆ ئەوانە سەرف بکرێت کە بە تەواوی خۆیان یەك لا کردۆتەوە لە هەوڵدان بۆ ئەوەی شەریعەتی الله تعالى حاکم و باڵا دەست بێت ئەوانیش (موجاهیدانن) چونکە هەر ئەوانن لوتکەی هەرە بەرزی ئەم ئیسلامەیان گرتوە ئەمڕۆ هەروەك لەم حەدیثە دا انس بن مالك دەفەرموێت پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرمووێت : (( ئیمانی تەواو نیە هیچ کەسێك لەئێوە تا منی لە منالەکانی ودایك وباوکی و هەموو خەڵکی بەگشتی خۆشتر نەوێت )) أخرجه البخاري في كتاب الإيمان والمسلم

← 2 الولاء على قدرالحسان والبراء على قدر السئات

خۆشویستن و پشتگیری کردن و سەر خستن بە گوێرەی کردەوە چاکەکانی و بەڕائەت و ڕقلێبوون و دووژمنایەتی کردنی بە گوێرەی خراپەکانی ئەم جۆرەیان سەرف دەکرێت و دەخرێتە کار بۆ موسوڵمانی تاوانبار ( عاصی ) بە بەڵگەی ئەم حەدیثەی خالد بن ولید کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی : ( پەروەردگار من بەریم لەو کارەی خالید کردی )

← 3 البراء التامة ڕق لێبوون و دوژمنایەتی کردنی تەواوەتی

بەڕائەتکردن ، ڕق لێبوون و دووژمنایەتی کردنی تەواوەتی : ئەمە سەرف دەکرێت دەخرێتە کار بەرامبەر ( موشریك ، کافری ئەصڵی ، مورتەدەکان )

ئەمەش جێ بەجێ دەکرێت بە : بەڕائەت کردن و ڕق لێبوونیان لە ناخەوە وە دژایەتی کردن و دووژمنایەتی کردنیان ، وە هەروەها بەوەی کە نابێت هیچ مەیلێکت هەبێت بۆیان وە نابێت موعجیب بیت پێیان ، وە نابێت لاسایيان کەیتەوە ، وەکو وترا دەبێت دژایەتی تەواویان بکەین و پێچەوانەی ئەوان

بکەین لە هەموو شتێك ، وە دەبێت جیهاد و قیتال بکرێت بەرامبەریان بە پارە و ماڵ و بە چەك و بە زمان .

هەموو ئەمانە کە باسمان کرد چ ئەوانەی کە دەبێت بەرامبەر ئیماندار بخرێتە کار یان ئەوانەی دەبێت بەرامبەر موشریك بخرێتە کار بە هەر سێ جۆرەکەی ( الولاء ) دەبێت موسوڵمان لە خۆیدا جێ بەجێ ی کات ئەمەش لە پێناو پارستن و سەلامەتی دین و ئیماندا ، وە ئیمانیش کامڵ و سەلامەت نابێت هەتا وەکو موسوڵمان ( الولاء و البراء ) لە خۆیدا جێ بەجێ نەکات ، هەر کات لە خۆتدا جێ بەجێت کرد ئەو کات ئیمان دامەزراو پتەوتر دەبێت هەر وەکو پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لەم حەدیثەدا دەفەرمووێت : (( پایەی پتەوی ئیمان ئەوەیە کە خۆشویستنت لە پێناو الله تعالى و بۆ ئەو بێت ، وە رق لێبوونیشت هەر لەبەر الله تعالى بێت و بۆ ئەو بێت )) (( اخرجه : امام احمد4/286 ))

ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە الولاء و البراء پایەی پتەوی ئیمانە هەروەها موسوڵمان تاوکو الولاء و البراء لە خۆیداجێ بەجێ نەکات بەو شێوەی کە الله تعالى داوای کردوە ئەوە شیرینی ئیمان ناچێژێت بە بەڵگەی ئەم حەدیثە کە انس بن مالك گێڕاویەتەوە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرمووێت (( سێ شت هەیە هەر کەسێك تێیدا بێت شیرینی ئیمانی چێشتوە

← 1 الله و پێغەمبەرەکەی لە هەموو کەس و لە هەموو شتێك زیاتر خۆش بووێت .

← 2 هەر کەسێک خۆشویستن و رق لێبوونەوەی لەبەر الله تعالى بێت .

← 3 پێی ناخۆشبێت بگەرێتەوە بۆ ناو کوفر دوای ئەوەی الله تعالى رزگاری کردوە لێی هەر وەکو چۆن پێی ناخۆشە فرێی بدەنە ناو ئاگرەوە .

وە هەروەها شێخ سلێمان بن عبدالله بن محمد بن عبدالوهاب رحمه الله تعالى كورەزای شێخ محمد بن عبد الوهاب دەفەرمووێت :
نە دین كاملْ و تەواو دەبێت ، نە عەلەمی جیهاد هەلْدەدرێت ، نە ئەمر بە چاكە و نەهی لە خراپە دەكرێت هەتا وەكو الولاء و البراء جێبەجێ نەكرێت

واتە هەتا وەكو هەموو خۆشویستن و ڕق لێبوونێكی موسولْمان لەبەر خاتری الله و بەو شێوەیە نەبێت كە الله تعالى داوای كردووە .

وە هەروەها دەفەرمووێت ئەگەر هەموو خەلْكی موتەفیق بن لەسەر یەك ڕێباز بە خۆشەویستی و بەبێ دووژمنایەتی و بەبێ ڕق لێبوون ، ئەو كات فەرق لە نێوان حەق و باطل دانامێنێت ، وە هەروەها فەرق لە نێوان كوفر و ئیماندا نابینرێت ، وە هەروەها جیاوازی لە نێوان دۆست و خۆشەویستانی الله تعالى و دۆست و خۆشەویستانی شەیطان دانامێنێت .

(( قول شیخ سلیمان فی كتاب رساله اوثق عری الإیمان ص ٣٨ ))

وە هەروەها شێخ حمدبن علی بن عتیق كە یەكێكە لە عولەمایانی اهلی نەجد لە بارەی البراء كردنی كافر و موشریكینەوە دەفەرموێت :

بزانن دووژمنایەتی كردن و بەڕائەت كردن و ڕق لێبوونی كافر و موشریكین الله تعالى واجبی كردووە و تەئكید لە واجبوونی دەكاتەوە وە خۆشەویستی و لاینگری و دۆستایەتی كافر و موشریكەكانی حەڕام كردووە زۆر بە توندی ، وە هەروەها دەفەرمووێت لە قورئاندا هیچ مەسەلەیەك نییە وەكو ئەم مەسەلەیە بەلْگەی ڕوون و ئاشكرای لەسەر بێت .

(( شێخ حمد بن علی بن عتیق من علماء النجد ولد في الزلفي سنة (١٢٢٧) هجري ، وتوفیت بالإفلاج سنة (١٣٠١) هجري ))

له دوای باسکردنی ولاء و پلەکانی دێینە سەر باس کردنی (١٠) شێواز بۆ موالات کردن و پشتگیری کردن و سەرخستنی ئیمانداران کە دەبێت ئیماندار ئەم (١٠) شێوازە لە خۆیدا جبەجێ بکات بۆ ئەوەی هەموو وەلائێکی بۆ ئیمانداران بێت ، بەرائەت و بوغض و عەداوەتی بۆ کافران بێت ، ڕێگاکانیش ئەمانەن :

← 1 کۆچکردن بۆ وڵاتی موسوڵمانان و جێ هێشتنی وڵاتی کافران .

کۆچکردن (هیجرة) : بریتییە لە جێ هێشتنی وڵاتی کافران و ڕۆشتن بۆ وڵاتی موسوڵمانان بە مەبەستی پاراستنی دین کۆچکردنیش بەم واتایە و لەبەر ئەم مەبەستە واجبە لەسەر موسوڵمانان و هەتاوەکو خۆر لە خۆرئاوا وە هەڵدێت و قیامەت هەڵدەستێت هەر دەمێنێ .

شێخ محمد بن عبدالوهاب رحمه الله دەفەرمووێت : کۆچکردن واتە ڕۆشتن و گواستنەوە لە وڵاتی موشریکەکانەوە بۆ وڵاتی موسوڵمانان یان لە ((دار شرك بۆ دار الإسلام))

بەڵگەش ئەم حەدیثەیە کە معاویە ڕیوایەتی کردوە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرمووێت : (( هیجرەت کۆتای پێنایەت ، تا وەکو تەوبە کۆتایی پێ نەیەت ، تەوبەش کۆتایی پێنایەت هەتا وەکو خۆر لە خۆرئاواوە هەڵدێت ))

((رواه : امام احمد فی مسند ، ابوداود حدیث رقم ٢٤٧٩))

هەروەها پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەو حەدیثەی کە ئیمامی ابو داود ڕیوایەتی کردوە لەگەڵ ئیمامی ترمزی دەفەرمووێت : (( من بەریم لەو کەسەی لەناو جەرگەی (وڵاتی) کافراندا لە نێو موشریکەکاندا دەمێنێتەوە ))

هەروەها شێخ محمد بن عبدالوهاب رحمه الله دەفەرمووێت : هیجرەت فەرزە لەسەر ئەم ئومەتە (ئومەتی ئیسلام) لە وڵاتی کافر و موشریکینەوە بۆ وڵاتی

موسوڵمانان واته له (دار شرک بۆ دار ئیسلام ) وه هەر دەشمێنێت هەتا قیامەت بەرپا دەبێت .

بۆیه مانەوه له وڵاتی کافراندا حەرامه و قەدەغەکراوه مەگەر کەسێك تواناى هیجرەتکردنی نەبێت به عوزری شەرعی که الله تعالى له قورئانی پیرۆزدا باسی کردوه . بەڵگەش لەسەر حەرامێتی مانەوه له وڵاتی کافراندا الله تعالى دەفەرمووێت : ( إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ ظَالِمِي أَنفُسِهِمْ قَالُوا فِيمَ كُنتُمْ قَالُوا كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِي الْأَرْضِ قَالُوا أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ اللَّهِ وَاسِعَةً فَتُهَاجِرُوا فِيهَا فَأُولَٰئِكَ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَسَاءَتْ مَصِيرًا ) النساء (٩٧) بە ڕاستی ئەوانەی له سەرە مەرگدا فریشتە گیانیان دەکێشن لەکاتێکدا ئەوان هەمیشە ستەمیان له خۆیان دەکرد (ئیمان و باوەڕیان له مەترسیدا بوو کەچی کۆچیان نەدەکرد بۆ نیشتمانی ئیمان، بەتوندیی پیایاندا هەڵدەشاخێن)و دەڵێن: باشە ئێوە له چیدا بوون و لەکوێ ژیانتان دەبردە سەر؟! له وەڵامدا دەڵێن: ئێمە بێ دەسەڵات و لاواز کراو بووین له زەویدا، فریشتەکان دەڵێن: باشە ئایا زەوی خوا فراوان و پان و پۆر نەبوو تا کۆچی تێدا بکەن و (کۆچ بکەن بۆ نیشتمانێک که ئیمانداران تیایدا فەرمانڕەوان یاخود سەربەستن)؟ ئا ئەوانە شوێنەواریان دۆزەخە، که جێگە و ڕێگە و سەرئەنجامێکی ناخۆش و ناسازو خراپە.

( إِلَّا الْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ وَالْوِلْدَانِ لَا يَسْتَطِيعُونَ حِيلَةً وَلَا يَهْتَدُونَ سَبِيلًا ) النساء (٩٨) مەگەر ئەوانەیان که بەڕاستی بێ دەسەڵات و ناتەوان و لاوازکراون لەو پیاوانەی ژن و منداڵیان لەگەڵدایەو ناتوانن تەگبیرو گۆڕانکاریەک بۆ خۆیان بکەن و هیچ ڕێگەیەکیش شارەزانین بۆ چارەسەرو دەربازکردنی خۆیان .

( فَأُولَٰئِكَ عَسَى اللَّهُ أَن يَعْفُوَ عَنْهُمْ وَكَانَ اللَّهُ عَفُوًّا غَفُورًا ) النساء (٩٩) ئا ئەوانە خوا لێبووردن و چاوپۆشی بۆ ئامادە کردوون و خوا هەمیشەو بەردەوام زۆر لێخۆشبووەو زۆریش چاوپۆشی دەکات (مەبەست لە وشەی ـ عسی ـ بۆ هاتنە دی بەڵێنە خواییەکەیە) .

یان کەسێك مەصلەحەتێکی دینی هەبێت وەکو بانگەوازکردن بۆ لای الله تعالی و بۆ دینی ئیسلام ئەمەش بە هەرەمەکی ناکرێت و دەبێت بە ئیزنی ئیمام بکرێت واتە ئەو کەسەی کە وەلی ئەمریەتی .

← 2 سەرخستنی موسوڵمانان و یارمەتی دانیان بە گیان ، ماڵ ، زمان لەو شتانەی کە پێویستیانە لە بواری دین و دنیادا :

الله تعالی دەفەرموێت : ( وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ) التوبة (٧١)

(لەو لاشەوە) ئیمانداران لە پیاوان و لە ئافرەتان هەندێکیان خۆشەویست و پشتگیرو هاوکاری یەکترن

وە هەروەها الله تعالی لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت : (وَإِنِ اسْتَنصَرُوكُمْ فِي الدِّينِ فَعَلَيْكُمُ النَّصْرُ إِلَّا عَلَىٰ قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَاقٌ) الأنفال (٧٢)

خۆ ئەگەر ئەو ئیماندارانەی (کە کۆچیان نەکردووە) داوای یارمەتی و پشتگیریان لە ئێوە کرد بۆ سەرخستنی ئاینی ئیسلام، ئەوە پێویستە لەسەرتان بکەن، جگە لەسەر ئەو عەشرەت و لایەنەی کەلە نێوان ئێوە و ئەواندا پەیمانێك هەبێت (ئەو پەیمانە مەشکێنن) .

← 3 ئازار چەشتن بە هۆی ئازارەکانیەوە ، دڵخۆشبوون بە هۆی دڵخۆشیانەوە

هەروەك پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت : (( نمونەی موسوڵمانان لە خۆشەویستی و سۆز و بەزەییاندا بەرامبەر یەکتری وەکو یەك جەستەوان

ئەگەر ئەندامێکی ئازار بکێشێت هەموو جەستەی بۆی دەناڵێنێت بە بۆنەی نەخۆشیەك )) .

هەروەها پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لە حەدیثێکی تر دا دەفەرمووێت : (( ئیماندار بۆ ئیماندار وەکو دیوارێك وایە هەدیکیان هەندێکی تریان بە هێز دەکەن ، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لە کاتێکدا ئەم قسەیەی فەرموو پەنجەکانی دەستی کرد بە ناویەکدا )) .

← 4 دڵ سۆزبوون بۆ موسوڵمانان و حەزکردن بەوەی توشی خێربن و غەش نەکردن لێیان وە هەڵنەخەڵەتاندنیان .

پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرمووێت : (( هیچ کامتان ئیمانی تەواو نیە هەتا ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ براکەشی پێی خۆش نەبێت )) . ( رواه بخاری ١٣ رواه مسلم ١٧٩)

هەر وە لەم حەدیثەشدا ئیمامی مسلم بە ژمارە ٦٧٠٦ لە صەحیحەکەیدا ڕیوایەتی کردوە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرمووێت : (( موسوڵمان برای موسوڵمانە بە چاوی سوکەوە سەیری ناکات و دەستبەرداری نابێت وە ڕا دەستی کافرەکانیشی ناکات ، ئەوەندە بەسە کە ئینسان تووشی شەڕ و خراپە بێت کە بە چاوی سوك سەیری براکەی بکات ، وە هەروەها هەموو موسوڵمانێك خوێن و ماڵ و شەرەفی موسوڵمانێکی تری لەسەر حەرامە )) .

هەروەها لەم حەدیثەشدا کە بخاری و مسلم ریوایەتیان کردوە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرمووێت : (( ڕقتان لە یەکتری نەبێت و پشت لە یەکتری مەکەن و لە کاتی کارکردندا شتومەکی یەکتری کەم بایەخ مەکەن ، باکەسیشتان کڕین و فرۆشتن نەکات بەسەر کڕین و فرۆشتنی کەستانەوە ، بەندەی الله و برای یەکتربن )) .

←5 ڕێزگرتنیان و بەکەم سەیرنەکردنیان ، وە عەیب دارنەکردنیان واتە گاڵتە پێنەکردنیان .

لەبەر ئەوەی الله عزوجل دەفەرمووێت : ( يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا يَسْخَرْ قَوْمٌ مِّن قَوْمٍ عَسَىٰ أَن يَكُونُوا خَيْرًا مِّنْهُمْ وَلَا نِسَاءٌ مِّن نِّسَاءٍ عَسَىٰ أَن يَكُنَّ خَيْرًا مِّنْهُنَّ وَلَا تَلْمِزُوا أَنفُسَكُمْ وَلَا تَنَابَزُوا بِالْأَلْقَابِ بِئْسَ الِاسْمُ الْفُسُوقُ بَعْدَ الْإِيمَانِ وَمَن لَّمْ يَتُبْ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ ) الحجرات (١١)

ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! هیچ کەس و هیچ هۆزێک گاڵتە بەکەس و هۆزێکی تر نەکات و زەلیلی نەکات، چونکەلەوانەیە ئەوان چاکتر بن لەمان، ژنانیش بەگاڵتە بەیەک نەکەن و یەکتر زەلیل نەکەن، چونکەلەوانەیە ئەمان لەوان چاکتر بن... سووکایەتی بەخۆتان مەکەن و یەکتری عەیبدار مەکەن (چونکەسووکایەتی بەیەکتر سووکایەتی یە بەخۆتان) هەروەها ناوو ناتۆرەی ناشیرین بۆ یەکتر دامەتاشن، ئای کەچەند ناشیرینە ناوو ناتۆرەی خراپ لەدوای باوەڕهێنان و موسڵمان بوون، ئەوەش تەوبەی نەکردبێت و پەشیمان نەبووبێتەووە لەگوناهەکانی، جا ئەو جۆرە کەسانەهەر ستەمکارن.

( يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اجْتَنِبُوا كَثِيرًا مِّنَ الظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ ۖ وَلَا تَجَسَّسُوا وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًا أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ رَّحِيمٌ ) الحجرات (١٢)

ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، خۆتان زۆر بپارێزن لەگومانی خراپ، لەڕاستیدا هەندێ لەو گومانانە گوناهو تاوانن (بۆیە حەق وایە لەهەموو گومانێک خۆپارێزبین) بەشوێن کەمو کووڕیی و عەیب و عاری یەکتردا مەگەڕێن و سیخوڕی مەکەن و لەپاش ملەباسی یەکتری بەخراپ مەبەن، ئایا کەستان خۆشی دێت لەوەی گۆشتی برای خۆی بەمردوویی بخوات؟! دیارە

کاری واتان زۆر پێ سەخت و ناخۆشە، دەی کەواتەلەخوا بترسن و پارێزگار بن، چونکەبەڕاستی خوا گەڕانەوەی خەڵکی وەردەگرێت و میهرەبانە بۆتان.

←6 بە خەمەوە بوونی موسوڵمانان لە کاتی خۆشی و ناخۆشی و نارەحەتیەکاندا .

بە پێچەوانەی دووڕووەکانەوە لە کاتی خۆشیەکاندا لەگەڵ موسوڵمانانن لە کاتی ناخۆشیشەکاندا پشتیان لێ هەڵ دەکەن

الله تعالی دەفەرموێت : ﴿ الَّذِينَ يَتَرَبَّصُونَ بِكُمْ فَإِن كَانَ لَكُمْ فَتْحٌ مِّنَ اللَّهِ قَالُوا أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ وَإِن كَانَ لِلْكَافِرِينَ نَصِيبٌ قَالُوا أَلَمْ نَسْتَحْوِذْ عَلَيْكُمْ وَنَمْنَعْكُم مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴾ النساء (١٤١) ئەوانەی کە خۆیان بۆ ئێوە مەڵاسداوە چاوەڕوانی بەسەرهاتتان دەکەن، ئەگەر سەرکەوتنێکتان لەلایەن خواوە دەست بکەوێت دەڵێن: ئەی ئێمە لەگەڵتاندا نەبووین؟! خۆ ئەگەر کافرەکان بەشێکیان ببێت لە سەرکەوتن، دووڕووەکان دەڵێن: ئایا ئێمە لەسەر ئێوەمان نەدەکردەوە و، نەمانهێشت ئیمانداران زیانتان پێبگەیەنن،

←7 سەردانی کردنیان و حەزکردن بەبینین و چاوپێکەوتنیان و کۆبونەوە لەگەڵیان .

وەك لە حەدیثێکی قودسیدا هاتووە الله تعالی دەفەرموێت : (( خۆشەویستی من واجب بووە بۆ ئەو کەسانەی کە لەبەر خاتری من سەردانی یەکتر دەکەن ))
( رواه : امام احمد ٢٣٣/٥/ کتاب صحیح جامع )

وە لەم حەدیثەشدا هاتووە کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت : (( پیاوێك سەردانی برایەکی کرد لەبەر خاتری الله ، الله تعالی مەلائیکەی ناردە سەر ڕێگەکەی و پرسیاری لێکرد بۆ کوێ دەچیت ؟ وتی سەردانی برایەکم دەکەم لەبەر خاتری الله تعالی ، مەلائیکەتەکە پێی فەرموو هیچت هەیە لە لای

لێی بسەنیتەوە یان هەر شتێکی تر ؟ پیاوەکەش وتی نەخێر تەنها ئەوەندە نەبێت کە من لەبەر خاتری الله خۆشم دەوێت ، مەلا ئیکەتەکەش پێی فەرموو من نێردراوی اللهم هاتووم بۆ لای تۆ بۆ ئەوەی کە پێت بڵێم کە الله تعالی ش تۆی خۆش دەوێت مادام تۆ ئەوت لەبەر خاتری الله تعالی خۆش دەوێت )) . ( مسلم گێڕاویەتیەوە بەژمارە ٦٧١٤ )

← 8 ڕێزگرتن لە مافەکانیان

هەندێك لە مافەکانی موسوڵمانان ئەمانەن کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ئاماژەی پێداوە کە نابێت کڕین و فرۆشتن بکرێت بەسەر کڕین و فرۆشتنی موسوڵمانانەوە ، ئەگەر ساوای شتی کرد نابێت تۆش بچیت ساوای بکەیت ، یان ئەگەر چووە خوازبێنی ئافرەتێك نابێت تۆ بچیتە داوای هەتا وەکو ئەو وازی لێدێنێت و جواب دەکرێت ، بە شێوەیەکی گشتی نابێت هەوڵی بە دەست هێنانی ئەو شتانە بدەیت کە ئەو پێش تۆ هەوڵی پێداوە

وەك پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرمووێت :

(( باهیچ کامتان کڕین و فرۆشتن نەکات بەسەر کڕین و فرۆشتنی براکەیەوە ، وە با نەچێتە داوای ئەو ئافرەتەی کە برا موسوڵمانەکەی چۆتە داوای )) (( رواه بخاری و مسلم ))

وە لە ریوایەتەکەی ئیمام مسلم داهاتووە

کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرمووێت : (( با ساوای شتومەکێك نەکات کە براکەی پێشتر ساوای کردووە )) .

← 9 بەزەی هاتنەوە بە موسوڵمانانی لاواز ، دڵ نەرم بوون نەرم و نیانی نواندن لەگەڵیان .

هەروەك پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرمووێت : (( لە ئێمە نییە ئەو کەسەی ڕێزی گەورەکان نەگرێت و بەزەیی نەیەتەوە بە بچووکاندا )) ( رواه : ترمزی ١٩١٩ )

هەروەها لەم حەدیثەشدا پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرمووێت : (( ئایا ئێوە سەر دەخرێن و رزق دەدرێن ئەگەر لاوازەکانتان نەبێت ؟ )) ( بخاری ٢٨٩٦ )

جگە لەمانەش الله تعالى دەفەرمووێت : ( وَاصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ تُرِيدُ زِينَةَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ) الكهف (٢٨) ئارام بگرەو خۆت ڕابگرە لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە خواپەرستی دەکەن و یادی پەروەردگاریان ویردی سەرزاریانە لە بەرەبەیان و دەمەو ئێوارانداـ مەبەستیانەو دەیانەوێت کە ئەو زاتە لە خۆیان ڕازی بکەن، ڕوو لەوان وەرمەگێڕەو ( ڕوو مەکە دنیاپەرستان و دەوڵەمەندان )

← 10 دووعاکردن بۆیان داوای لێخۆشبوون کردن بۆیان :

الله تعالى دەفەرمووێت : ( وَاسْتَغْفِرْ لِذَنبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ ) محمد (١٩) داوای لێخۆشبوون بکە لە الله بۆ گوناهی خۆت و ئیمانداران لە پیاوان و ئافرەتان .

هەروەها لە ئایەتێکی تردا الله تعالى دەفەرمووێت : ( رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ) الحشر (١٠) پەروەردگارا لە ئێمە و لە برایانەشمان خۆش ببە کە پێش ئێمە ڕێبازی ئیمانیان گرتەبەر و لە دڵەکانماندا هیچ جۆرە بوغزو کینەیەک مەخەرە دڵمانەوە لە

ئاستی ئەوانەی ئیمانیان هێناوە، پەروەردگارا تۆ بەڕاستی بەسۆزو بەخشندە و میهرەبانیت .

جا لێرە پێویستە ئاگاداری ئەم ئایەتەبین ئایەتی ٨ سورەتی المتحنة : ( لَّا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ ) المتحنة (٨) دڵنیاش بن کە خوا قەدەغەی ئەوەتان لێ ناکات کە چاك ڕەفتاری و دادپەروەری بکەن لەگەڵ ئەو کەسانەدا جەنگیان دژ نەکردون و دژایەتی ئاینیان نەکردون و لە شوێنەوارتان دەریان نەکردون، چونکە بەڕاستی خوا دادپەروەرانی خۆش دەوێت .

تێبینی/ بەڵام نابێت ئەم باشبوون و عادل بوونە لەگەڵیان سەر بکێشێت بۆ وەلاء خۆشەویستی بۆیان چونکە ئەوان هەر چۆنێك بێت هەر بێ باوەڕ و کافرن کە واتە نابێت لە دڵەوە خۆشمان بوێن لەبەر ئەوەی الله تعالى دەفەرموویت : ( أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ ) واتە/چاکەیان لەگەڵدا بکەن و عادل بن لەگەڵیاندا .

سەرنج بدەین لە ئایەتەکە و لە تەفسیرەکەی باسی چاکەکردن باشبوون و عادل بوون دەکات لەگەڵیاندا نافەرموویت ولاء و دۆستایەتیتان هەبێت بۆیان خۆشتانبووین و یارمەتی دەرو سەرخەریان بن و پشت گیریان بکەن .

ئایەتێکی تریش هەیە لەسورەتی القمان ئایەی ١٥ لە بارەی چاکەکردن و باشبوون لەگەڵ دایك وباوکدا ئەگەر بێ باوەڕیش بوون الله تعالى دەفەرموویت : ( وَإِن جَاهَدَاكَ عَلَىٰ أَن تُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا وَصَاحِبْهُمَا فِي الدُّنْيَا مَعْرُوفًا وَاتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَيَّ ) القمان (١٥) ئەگەر دایک و باوکت کۆششیان لەگەڵتا کرد، تا بەبێ هیچ بەڵگە و زانیاریەک هاوەك بۆ من قسەیان مەکە، لە دنیاشدا هاوڕێ و هاوەڵ و خزمەتگوزارێکی چاك بە بۆیان لە هەموو بارو دۆخێکدا، شوێنی ڕێبازی ئەوانە بکەوە کە بۆلای من گەڕاونەتەوە ،

هەروەها لەم حەدیثەشدا کە ئیمامی بخاری گێڕاویەتیەوە لە صەحیحەکەیدا بە ژمارە ٢٦٢٠ و ئیمامی مسلم بەژمارە ٢٣٧٢ هێناویەتی دایکی أسماء هات بۆ لای أسماء پێی وت سەردانم بکە لە کاتێکدا دایکی کافربوو ، أسماء ئش داوای ڕوخسەتی لەپێغەمبەر صلی الله علیه وسلم کرد ، پێغەمبەر . صلی الله علیه وسلم پێی فەرموو (صلی أمك) واتە سەردانی بکە .

لەگەڵ خوێندنەوەی ئەم ئایەتەی سورەتی المتحنة (٨) کە باسمان کرد دەبێت کە الله تعالی لە چەندین ئایەتی تردا باسی بەڕائەت کردن ، ڕق لێبون ، دووژمنایەتی کردنی کافری ئەصڵی و مورتەدمان بۆ دەکات کە هەر چەندا نزیکترین کەسیشمان بن .

نمونە الله تعالی دەفەرموویت : ( لَّا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ ) المجادلة (٢٢)

کەسانێکت دەست ناکەوێت باوەڕ بهێنن بە خواو بە ڕۆژی دوایی ، لەکاتێکدا کەسانێکیان خۆش بوێت کە دژایەتی خواو پێغەمبەرەکەیان کردبێت، ئەگەرچی ئەو دوژمنانە باوو باپیریان بن یان نەوەیان بن یان برایان بن یان عەشیرەتیان بن ،

جا سەرنج دان و وردبوونەوە لە هەردوو ئایەتەکە (الممتحنة ٨) (المجادلە ٢٢) بۆمان ڕوون دەبێتەوە و دەزانین پێویستیشە بزانین کە (( سەردانی کردنی دایك و باوکی کافر و چاکبوونێکی دنیای یان عادل بوون لەگەڵ کافراندا شتێکەو ))

خۆشەویستی (الولاء) شتێکی ترە ، الله تعالی نەهی لێکردوین لە چەندین ئایەت هەڕەشەی دنیایی و ئاخیرەت لەسەر داناوە .

بۆیە ئەو شتانەی الله تعالی ڕێگەی پێداوە بەرامبەر کافر بکرێت و کە ( سەردانی کردنی دایك و باوکی کافر ، باشبوون و عادل بوون لەگەڵیاندا لە ئومور و مامەڵە دنیاییەکاندا ) ئەمانە بە وەسائیلی بانگەواز و دەعوە هەژمار دەکرێت ، چونکە ئەم شتانە وا لە کەسی کافر دەکات حەز و مەیلی بۆ ئیسلام زیاد بکات .

بە پێچەوانەی خۆشەویستی (الولاء) کە ئەمانە بەڵگە و ئاماژەن بۆدان نان بەوەی کە ئەوان لەسەرینی و ئاماژەن بۆ بە ڕاست زانینی بەرنامە و بیر و باوەڕیان و ڕازیبوون پێی ، ئەمەش دەبێتە هۆی بانگ نەکردنیان بۆ ئیسلام .

وە لە هەمان کاتداحەڕامێتی موالات و خۆشەویستی کافران کە الله تعالی حەڕامی کردوە ، بەو واتایە نایەت کە ئیتر مامەڵەی بازرگانی حەلاڵیان لەگەڵدا نەکرێت ، وە یان شتومەك و کەلوپەلی ئەوان هاوردە نەکرێت ، وە سود وەر نەگیرێت لە لێهاتوی و داهێنانەکانیان .

پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم خۆی (ابن أور یقط اللیثی) بە کرێ گرت کە کافریش بوو تا ڕێگەی پێ نیشان بدات . وە هەروەها پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم قەرزیشی لە هەندێك لە جولەکەکان وەرگرتووە .

ئەوەتا موسوڵمانان بەردەوام شتومەك و دروستکراوی بە سود هاوردە دەکەن لە لای کافرەکانەوە ، ئەمە دەچێتە بابی کڕین و فرۆشتنەوە پارە لە نێوانیاندا هەیە ئەگەرنا ئەوان هیچ فەضڵ و منەتێکیان نییە بەسەر ئێمەی موسوڵمانەوە ، وە ئەم شتانە هیچی نابێتە هۆکاری ولاء و خۆشەویستی بۆیان .

جا الله عزوجل چۆن خۆشەویستی موسوڵمانان و ولاء دەربڕین بۆیانی واجب کردوە ، بە هەمان شێوە ڕق لێبوونی کافران و بەڕائەت لێکردنیانی واجب کردوە لەسەر ئیمانداران .

الله تعالى دەفەرمووێت : ﴿ إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَهَاجَرُوا وَجَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالَّذِينَ آوَوا وَّنَصَرُوا أُولَٰئِكَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَلَمْ يُهَاجِرُوا مَا لَكُم مِّن وَلَايَتِهِم مِّن شَيْءٍ حَتَّىٰ يُهَاجِرُوا وَإِنِ اسْتَنصَرُوكُمْ فِي الدِّينِ فَعَلَيْكُمُ النَّصْرُ إِلَّا عَلَىٰ قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَاقٌ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾ الأنفال (٧٢)

بە ڕاستی ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و کۆچیان کردووەو تێکۆشاون لە پێناوی ئاینی خوادا بە خۆیان و ماڵ و سامانیانەوە، ئەوانەش کە پێشوازیان لە کۆچبەران کردو لەماڵ و حاڵی خۆیاندا جێیان کردنەوە و پشتگیریان کردن، ئا ئەوانە هەندێکیان پشتیوانی هەندێکی تریانن، ئەوانەش کە باوەڕیان هێناوەو کۆچیان نەکردووە، ئەوە بۆتان نیە پشتگیریان بکەن لەهیچ شتێکدا هەتا ئەوانیش کۆچ دەکەن ( بۆ بەهێزکردنی دەوڵەتی ئیسلام ) ، خۆ ئەگەر ئەو ئیماندارانەی (کە کۆچیان نەکردووە) داوای یارمەتی و پشتگیریان لە ئێوە کرد بۆ سەرخستنی ئاینی ئیسلام، ئەوە پێویستە لەسەرتان بکەن، جگە لەسەر ئەو عەشرەت و لایەنەی کەلە نێوان ئێوە و ئەواندا پەیمانێک هەبێت (ئەو پەیمانە مەشکێنن)، خوای گەورەش بینایە بەو کارو کردەوانەی کە دەیکەن .

﴿ وَالَّذِينَ كَفَرُوا بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ إِلَّا تَفْعَلُوهُ تَكُن فِتْنَةٌ فِي الْأَرْضِ وَفَسَادٌ كَبِيرٌ﴾ الأنفال (٧٣)

ئەوانەش کە بێ باوەڕ بوون ، هەندێکیان پشتیوانی هەندێکی تریانن و پشتیوانی لە یەکتر دەکەن، خۆ ئەگەر ئێوەی ئیماندار کۆمەک بە یەکتر نەکەن و پشتی یەکتر نەگرن ئەوە لەسەر زەویدا ناخۆشی و ناکۆکی و گوناهو تاوانی گەورە پێش دێت ( ئازار و ناخۆشی بۆ ئێوەی ئیماندار پێش دێت ) .

ابن كثير له تەفسیری ئەم ئایەتەی سورەتی ئەنفالدا ٧٢ – ٧٣ دەفەرمووێت واتای ئەم ئایەتە ئەوەیە ئەگەر لەو هاوبەش پەیداکەرانە دوور نەکەونەوە و ولاء تان نەبێت بۆ ئیمانداران ئەوا فیتنەیەکی زۆر گەورە لە ناو خەڵکدا دەخولْقێت کە ئەویش سەر لێ تێکچوونی خەڵکە و تێکەڵ بوونی کافرەکانە بە ئیمانداران .

سبحان الله ئەوەش ئەو فیتنەیە کە ئەمڕۆ بڵاوە الله پەنامان بدات ئەو کەسانەی کە (الولاء و البراء) یان بەسەردا جێبەجێ دەکرێت ئەمانەش دەبێت بە چەند بەشێکەوە واتە خەڵکان لە (الولاء و البراء ) سێ بەشن :

← 1 بەشی یەکەم : ئەو کەسانەی دەبێت خۆشبوویسترێن بە خۆشەویستیەکەی پا و بەبێ دژایەتی

کە ئەمانەش بریتین لە ئیماندارە پاکەکان و پێغەمبەران ڕاستگۆکان و شەهیدان و پیاو چاکان وە لە هەموویان لە پێشتر پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم کە واجبە لە خۆمان و ماڵ و منداڵمان و دایك و باوکمان و لە هەموو کەس زیاتر خۆشمان بووێت ، پاشان خێزانەکانی دایکی ئیمانداران ، وە پاشان ئەهل و بەیتە پاکەکەی ، وە هاواڵە بەڕێزەکانی بە تایبەتی خەلیفەی ڕاشدینەکان ، وە ئەو شەش کەسەی تریش کە لە دە کەسەکەن کە موژدەی بە هەشتیان پێدراوە ، وە پاشان موهاجیرەکان و ئەنصارەکان ، وە ئەهلی بەدر و بەیعەتی ڕیضوان ، پاشان هەموو صەحابەکان بە گشتی ( الله تعالی لە هەموویان ڕازی بێت ) ، پاشان تابیعینەکان و پێشینەکانی ئەم ئوممەتە و پێشەواکانی ئەم ئوممەتە وەکو (شافعی ، احمد ، مالك ، ابو حنیفە) الله

تعالى دەفەرموویت : ( وَالَّذِينَ جَاءُوا مِن بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ) الحشر (١٠)

ئەوانەش کە بە شوین کۆچبەران و پشتیوانانادا هاتن (تا کۆتایی دنیا ئەمە دۆعا و نزایانە و بەردەوام) دەڵێن : پەروەردگارا لە ئێمە و لە برایانەشمان خۆش ببە کە پێش ئێمە ڕێبازی ئیمانیان گرتەبەر و لە دڵەکانماندا هیچ جۆرە بوغز و کینەیەک مەخەرە دڵمانەوە لە ئاستی ئەوانە .

جا بۆیە هەر کەسێك ئیمانی لە دڵدا بێت ڕقی لە پێشینی ئەم ئومەتە و هاوەڵانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم نابێت ، بەڵکو کەسانێك ڕقیان لێیانە کە لەڕێ لا چوون دووڕ و موونافیق و دووژمنی الله تعالى و پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم و ئیسلام و موسوڵمانانن .

← 2 بەشی دووەم : ئەو کەسانەن کە دەبێت موسوڵمانان لە ڕویەکەوە خۆشیان بوێن لە ڕویەکیشەوە ڕقیان لێیان بێت .

ئەم جۆرە کەسانە خۆشەویستی و ڕقیان تێدا کۆدەبێتەوە ئەمانەش ئەو موسوڵمانانەن کە سەرپێچی و مەعصیێتیان زۆرە ، دەبێت خۆشبوویسترێن لەبەر ئیمانەکەیان ، وە دەبوغزێنرێن لەبەر تاوانەکانیان بە مەرجێك شرك و کوفریان نەبێت ، خۆشویستنیان پێویستی بە ئامۆژگاری کردنیان و ڕێگری کردنیان هەیە لە کاری خراپ ، هەروەها دروست نییە بێدەنگ بوون لە سەرپێچی و مەعصیێتەکانیان بەڵکو ڕێیان لێدەگیرێت و فەرمانیان پێدەکرێت بە چاکە و ڕێگریان لێدەکرێت لە خراپە و حەدی شەرعیان لەسەر جێ بەجێ دەکرێت یان تەمبێ ( تەعزیر ) دەکرێن هەتا وەکو واز لەسەر پێچیەکانیان دێنن و وە تەوبە دەکەن لە تاوانەکانیان . ئەمانە خۆشەویستی ولاء یان بۆسەرف ناکرێت وەك ئیمانداره خالیصەکان کە لە بەشی یەکەم باسمان کرد ،

بەڵكو عادیلانەترین مامەڵە كردن لەگەڵیان ئەوەبوو كە باسمان كردوە ، ئەمەش مەزهەبی ئەهلی سوننە و جەماعەیە .

وە خۆشەویستی و ڕقلێبوون (الولاء و البراء) لە پتەوترین پایەكانی ئیمانە هەروەك پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرمووێت : (( پایەی پتەوی ئیمان ئەوەیە كە خۆشەویستیت لە پێناو الله بێت ، ڕق لێبوونیشت هەر لە پێناو الله بێت ))

(اخرجة: بیهقی ، امام احمد ، امام حاكم)

مرۆڤیش لە ڕۆژی قیامەت لەگەڵ ئەو كەسانەیە كە لە دنیادا خۆشیویستوون هەروەكو چۆن لە فەرموودەی پێغەمبەر صلی اللە علیه وسلم هاتووە : (( المرء مع من احب یوم القیامة )) ( بخاری گێڕاویەتیەوە )

بەڵام ئێستا گۆڕاوە زۆرینەی خەڵك خۆشەویستی و ولائیان بۆ كەسانی تر لە پێناو دنیایە و هەر كاتێك تەماعی دنیاییان تێدا هەبێت وەلائیان بۆی هەیە ئەگەر چی دووژمنی الله تعالی و پێغەمبەر و موسوڵمانانیش بن ، وە هەر كەسێكیش تەماعی دونیاییان پێی نەبێت دووژمنیانە ئەگەر چی خۆشەویستی الله و پێغەمبەرەكەشی بێت لەبەر بچوك ترین هۆكار دڵتەنگ و بێتاقەتی دەكات بگرە سوكایەتیشی پێ دەكات .

هەروەك ابن عباس ( عبدالله بن عباس ) الله لێی ڕازیبێت دەفەرمووێت : (( هەر كەسێك خۆشەویستی و ڕقی لە پێناو الله تعالی دا بێت ، وەلاء و دۆستایەتیشی لەبەر خاتری الله تعالی بێت ، برائەت و دووژمنایەتیشی هەر لە پێناو الله تعالی بێت ، ئەوە تەنها بەمە خۆشەویستی الله تعالی بە دەست دێنێت ، بەڵام ئێستا وای لێهاتووە خەڵك لەبەر خاتری دنیا ( مصلحەتی دونیایی ) برایەتی و دۆستایەی یەكتر دەكەن وە هیچ سودێكیان پێناگەیەنێت )) .

( ابن جرير الطبرى ) گێڕاویەتیەوە الله تعالی پەنامان بدات و لەو کەسانەمان بگێڕێت کە ولاء و برائمان تەنها لەبەر خاتری خۆی بێت و نێتمان پاك بێت و دوور بێت لە مەصلّەحەت و بەرژەوەندی دونیایی ئەگەر سەرنج بدەین لە قەولەکەی ابن عباس لە سەردەمی ئەم پیاوە بەڕێزانەی وەك عبدالله بن عباس خەڵك ئاوا گۆڕابن وەك خۆی باسی دەکات ، ئاخۆ دەبێت ئێستا حاڵی خەڵك لەم سەردەمە و لەزەمەنی فیتنە و فەساد و دوونیا ویستیا حاڵی ئومەتی چۆن بێت لە جێ بەجێ کردنی الولاء و البراء دا .

لە ئەبو هوریرەوە الله لێی ڕازیبێت دەڵێت پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەیفەرموو الله تعالی فەرموویەتی : (( هەر کەسێك دووژمنایەتی خۆشەویستێکی من بکات دڵنیا بێت من اعلانی حەربی لەگەڵ دەکەم )) ( من حەربی لەگەڵ بەرپادەکەم ) . (بخاری گێڕاویەتیەوە بەژمارە ٦٥٠٢)

وە توندوتیژترین دووژمنایەتی خەڵك بکات لەگەڵ الله تعالی دا دووژمنایەتی کردنی هاوەڵانی پێغەمبەرە صلی الله علیه وسلم وە جنێو پێدانیان و بە کەم سەیرکردنیانە .

وە لەم حەدیثەشدا کە ئیمامی تەرمزی ریوایەتی کردوە بەژمارە (٣٨٦٢) وە غەیری ئەویش چەن کەسێکی تریش ڕیوایەتیان کردوە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی : (( الله لەم هاوەڵانەی من ، مەیاکەنە ئامانج ، چونکە هەر کەسێك ئازاری ئەوان بدات ئازاری منی داوە ، هەر کەس ئازاری منیش بدات ئازاری الله تعالی داوە ، هەر کەسیش ئازاری الله تعالی بدات ئەوە زۆر نزیکە الله عزوجل غەزەبی لێبگرێت )) .

بەڵام ئێستا دووژمانەیەتی کردن و جنێودان بە هاوەڵانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بۆتە دینداری و عەقیدە لای هەندێك لە کۆمەڵ و دەستە و تاقمە گومڕاکان وەك (ڕافضە) کە جنێو بە دایکە عایشە ، امامی ابوبکر ، امامی عمر دەدەن الله لە هەر سێکیان ڕازی بێت ، پەنا دەگرین بە الله تعالى لە توڕەبوون و سزا قورسەکەی ، وە داوای بەخشین و سەلامەتی لێدەکەین .

← 3 بەشی سێیەم : ئەمانەش ئەو کەسانەن کە دەبێت موسوڵمانان زۆریان ڕق لێیان بێت و دووژمنایەتیان بکەن بە دووژمنایەتیەکەی تەواو بەبێ هیچ خۆشەویستی و وەلائێك ، ئەمانەش بریتین لە کافرەکان ، موشرکین ، مورتەدین ، مولحیدین ، مونافیقن ، ... هتد جا هەر ڕەگەزێك بێت .

وەك پێشتر باسمان کرد شێخ حمد بن عتيق رحمه الله دەفەرموویێت لە بارەی بەڕائەت کردن و وە دووژمنایەتی کردن و ڕق لێبوونی کافر و موشریکینەوە دەفەرموویێت بزانن دوژمنایەتی کردن و ڕق لێبوون و بەڕائەت لێکردنی کافر و موشریکین الله تعالى واجبی کردەوە و وە تەئکید لە واجب بوونی دەکاتەوە ، وە خۆشەویستی و لایەنگری و دۆستایەتی کافر و موشریکانی حەڕام کردوە زۆر بە توندی ، هەروەها دەفەرموویێت لە قورئاندا هیچ مەسەلەیەك نییە وەك ئەم مەسەلەیە بەڵگەی ڕوون و ئاشکرای لەسەر بێت کەواتە بەڕائەت لێکردنی بۆ باوەڕەکان شەرتی ئیمانە ، جا لە هەر جنس و هۆز و نەتەوەیەك بن .

بەم بەڵگانە : (لَّا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ أُولَٰئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الْإِيمَانَ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٍ مِّنْهُ وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ أُولَٰئِكَ حِزْبُ اللَّهِ أَلَا إِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْمُفْلِحُونَ)المجادلة (٢٢)

کەسانێکت دەست ناکەوێت باوەڕ بهێنن بە خواو بە ڕۆژی دوایی، لەکاتێکدا کەسانێکیان خۆش بوێت کە دژایەتی خواو پێغەمبەرەکەیان کردبێت ، ئەگەرچی ئەو دوژمنانە باوو باپیریان بن یان نەوەیان بن یان برایان بن یان عەشیرەتیان بن، ئەوانەی کە بەو شێوەیەن (ئیمان و باوەڕیان لە هەموو کەسێک لا بە نرخترو پیرۆزترە)، خوا ئیمان و باوەڕی لەدڵیاندا چەسپاندووەو جێگیری کردووەو لە بەهرەو میهرەبانی تایبەتی خۆی، وە بە هێزو گیانێکی تایبەتی لەلایەن خۆیەوە (مەبەست قورئان و ئیمانە) پشتگیری کردوون و یارمەتی داون، سەرنجامیش دەیانخاتە باخەکانی بەهەشتەوە کە چەندەها ڕوبار بەژێر درەخت و کۆشکەکانیدا تێ دەپەڕێت، هاوڕێ لەگەڵ ژیانی بەبرِاوەدا، ئەوانە خوا لێیان ڕازیە و ئەوانیش لە خوا ڕازین، ئا ئەوانە دەستەو تاقم و حزب و لایەنی خوای گەورەن، ئاگاداربن کە بەڕاستی هەر لایەن و حزب و دەستە و تاقمی خوا سەرکەوتوو و سەرفرازن .

(تَرَىٰ كَثِيرًا مِّنْهُمْ يَتَوَلَّوْنَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَبِئْسَ مَا قَدَّمَتْ لَهُمْ أَنفُسُهُمْ أَن سَخِطَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ وَفِي الْعَذَابِ هُمْ خَالِدُونَ) المائدة (٨٠)

زۆربەیان دەبینیت ڕازین بەخۆشەویستی و پشتیوانی ئەوانەی کە بێ باوەڕ بوون، سوێند بە خوا دەست پێشکەرییەکی خراپیان بۆ خۆیان ئەنجامداوە کە خوایان لە خۆیان تووڕە کردووە (بەو کارەیان)، (لە قیامەتیشدا) لەناو سزای دۆزەخدا دەبێت بۆ هەمیشە بمێننەوە .

(وَلَوْ كَانُوا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالنَّبِيِّ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مَا اتَّخَذُوهُمْ أَوْلِيَاءَ وَلَٰكِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ) المائدة (٨١)

خۆ ئەگەر ئەوانە باوەڕیان بەخواو بەم پێغەمبەرەو ئەو قورئانە ببوایە کە بۆی دابەزیوە، ئەوە ئەوانەیان نەدەکرد بەخۆشەویست و سەرپەرشتیاری خۆیان، پشتیان

